
به ذمارەي
تەلەفۆنە كا
عالەم
شيعر ١٣٧٨
سالح سوزة

# بەژمارەيتەلەفونەکاني

sozeni@yahoo.com

## - 1 -

**ئەم ئەشقەش فت ..باری**

/ باڵق بوونێکی نویٚ بوو لە چلی دا/

درکیٚ درۆ بوو لە خۆما /شکا/

/سوێندمان پیٚ دەبرژان/

شێعرمان پیٚ نەدەخڵەتاوان

بۆ ئەشقیٚ کە فت بوو.../فت نازانم یانی چ‌ی/

چلی چلەو چڵە ئاگرێکی بچووك رژا

نەیگرتم ــ تۆ

{ برۆ بژی و خۆشیش بژی!}

شاعیریان نە گوتوە بمژیٚ

شاعیر دەبیٚ وشە ژن

شاعیر «شەمۆ» بوو /شێت/

[illegible]

**بە ژمارەی تەلەفۆنەکانی عالەم**

**بە عالەمی فت بوونی عالەم**

**شاعیریان گوتوە وشە**

**بخوا و**

**بنۆسێ و**

**بکا**

**پێمەڕە بۆ یاس**

**یاس هەڵداتەوە بە دڕوودا**

**/دڕوویاس/**

**یا پاس..**

.............

**شاعیریان گوتوە گ.. بخوا وخۆی هەڵمسێنێ**

**← / تازەگەری/ →**

**کە بەردی بە ئاسمانەوە وەستاندووە**

**باڵی کردووتە مل کەر**

**{ئەرێ شاعیر ئازان}**

**بە کەوش ئەڵێن بفرە !**

**بە مەل ئەڵێن بدوو..!**

سولێمان →

ــ بۆق دەنگی زرە و زەنگۆڵەی لەملی کەر دزیوە

بۆ نافامن ؟

منشاعیرم !

شاعیریان گوتووە

← درێژ بێتەوە ، نەپان →

« تا ئەو کاتەی سەری ئەدا لە شتێ نەرم»

/نوێخوازیە! بۆ نافامێنن؟؟/

ــ من شیعرم :

کە شاعیرێکم «شەرتی» کردوە

شەوانە بەر لەوەی بمرێ

جلی تایبەت لە بەر بکا..

دەفتەرێ شرٍ بکاتە مل ..

{لای مندالەکانی بلَێ :

ئەرێ. رۆڵە باوکتان شاعیرە!}

ــ شاعرێتی ، فش بوونەوەیە بەسەر

فەلسەفە و

هێلکە هەلَرِشتنی درۆیە

بۆ ئەو مریشکانەی

شەوانە خەو بە چۆلەکەوە ئەبینن

«بووگەسە» کەلَەشێر

/ئەرێ ! کچی قژ نازانم کارەبایی، یان لە دەورەی

ئینتێرنێتا «بوور»/

Online Services

من شاعیرم!

ئەها ریشم چەندە پانە!!

ــ{ لە سەردەمی کارەبا دا «نالی» چەند بڵێی برٍ

بکا؟}

شاعیر شەوانە رۆژ هەڵدەبەسێ و

رۆژانە شەو ئەهۆنێ بە ئەسپێکا!!!

کە رەنگە رۆژێ ببێ بە کەر..

{یان بە پێچەوانەوە...}

یا فریشتە ئەکا بە گوڵ

گوڵی ئەوگوڵەش بە گوڵێکی

بۆن نازانم چ رەنگ؟

رەنگ.. رەنگ......

ئەوگوڵەش بەگوڵێ ڕەنگ...

ئەرێ شاعیری ناخوش نییە:

زرینگە زرتە زرٍە زرمە زیرە ..

هەمووی لە زێهنی زەردەواڵەیەکەوە ئەشنن

ــ من شاعیرم کورٍم ، پێمەکەنە!

شاعیر تەنیا«شەمێ» نەبوو

{دەستی ئەرخایەنی دەخستە پاڵ گوێچکەیەوە و
لە دڵەوە «ماڵم شەمێی»، بەو کراس سوورەدا
دەگوت.. سەدان متر لە ئەو دوور تر، شووشەی
خاوێن ئەکردەوە..بە رواڵت . خۆ ئەزانی بۆ؟}
ــ شەمێ ئەوەندە شاعیر بوو
نە ئەیزانی خەم چییە و
ئە خەمی ئەکردە دەزگیران
{ وەک ئەوەی دواجار بوو بە مۆد}
/بە جگەرەیەکی وینستۆنەوە.../
ــ« هەی شەمێ ماڵم شەمێ.. عەمرم
شەمێ.....»
شاعیرێتی ، هەرگیز لە تۆی تێنەپەڕاند
ئەگەرچی وەک «شێرکۆ بێکەس»
هەزار چیاشی گرتبێ بۆ پێشمەرگە
یا وەکوو من ،
/چی قسەی قۆڕی جیهان هەیە لە شیعری پێ
سەرەک تر بێ/
«ئەری شەمێ .. عەمرم شەمێ..»
{من بەم ریشە پانەشمەوە، بە تۆ ناپشمم! نە
شێرکۆ و رەفێق و ئەم ئاخرانش
«بەختیار»

که فەلسەفە ئەماسێنیَ له

« هایدگێر»ەوە

بۆ رۆمان........بگرێ

ـــ خەونە بچووکەکانمان بتۆرێنن...بیکەنە

گەردن ،

خەونێکی ملهوڕ،

{ زرمە..هارە..تەقە. شەقە. ئەگەرنەچی}

ئەریَ شەمیَ!

.. خەونی ملهوڕ لەم دەورەدا

بە پارەش بیَ زۆرتر دەکا

/چەندمسقالَ دۆلار، مارك ، لیرە../

ـــ ئەی خەونە بچووکەکانی ئێواران

مەپەشۆکن ! مردن حەقە!!

{ ئەو ساتانەی خەونیَ گەورە بەتاو دێت و

بەجلی دەعباییەکی نوێوە،

دارەکانی بەر حوجرەکەی نالی و

رێحانەی بەرپەنجەرەکەی مالَی ئێمە و

...هەلَدەکەنیَ ... و...

خەونە بچکۆلَەکانی پشت گوێی شەمیَ و ....

/چەند ئەحمەق بووم، لەوانە بوو بۆیەکیٚ لە و

ملهوڕانە... خەون ئەڵیم... خەون... ئیٚعدامم

کەن/

شاعیریٚتی... هیٚند ئاسانە

ئەتوانی، بیدەیتە دەست «سۆران» بۆت بکیٚشی

بابا نان ندارد

مادر سیگار میکشد...

What would you like to do?

Add text to a drawing object or picture..

منیش درۆم ئەخوارد،ئەمپیشانا

بەم قەڵافەتە نەحسەوە

/خۆشم بیزم لیٚی دیٚتەوە/گەمە/

بە قەدەر سۆران و تۆ/ یان تۆ و سوران  فەرقیٚ

نارژیٚ/

شاعیر نە بووماین.....

ئەم عەشقەش فت دایکرد

باڵق بوونیٚکی نویٚ بوو.. لە چلی دا

بەتۆ وە/ کە دەمزانی شیعری/:

تووڕام:  «سەرم بڕی و تووڕم دایە

کۆلاٚنەکەی ماڵ «شەمیٚ» وە

«هەی شەمیٚ... ماڵم شەی ... ئیزن ئیستە لە

کیٚ بگرم

من شەرعی دنیا دەکەم، تۆم بەحلاّلی دەنیّ..»

دڵنیا بووم، شەمیّ لای وا بوو حەلاّلی، یانی

رووتی...و

شەرعیش لای ئەو... یانی پرسیار..

نەمردم

درۆم خۆم لەگەڵ

بەلاّم شیّعر... بەلاّم شەمیّ...

نەدەخڵەتان...

من شاعیر نیم

بەم ریشە پانەشمەوە...

ئەریّ کورِم   /پیّمەکەنە /

{نالی بیچارە ناچار بوو، لەبەر خەڵك، شیعر بە

خواییش دا بڵیّ..}

بەژمارەی

تەلەفۆنەکانی

هەر هەمووومان

درۆ ئەکەین بۆ گا...

بۆ تیّناگەن؟؟

ئەها ریشم چەندە پانە!

«زبوولی نیکسە دەگیِّریّ، کە عەکسی ریش

بەشیر»

ــ پیغەمبەر کا،

چی شاعیری جیهان هەیە

هەمووی بفڕن

چی شیعرۆڵەی جوانیش هەیە

هەموو بگێـ....

ناوەکان با دڵبەخش‌کەین، بەسەربانّدە خۆیاندا

بەسەر پەپوولە خۆیاندا

بەسەر گوڵەکان خۆیاندا

ــ ڕوومەت چی لە سوور گوڵ داوە؟ ــ

شیعر باڵندە بۆ بگریّ؟

پەپوولە بۆ بسووتێنین ئەمە چیە شێعر ئەڵێین؟

دایک و باوک خۆشک وکەس و کارتان مانگا!

بەژمارەی تەلەفۆنەکانی عاڵەم

«ئیستەش نازانم ژمارە چۆن ئەگیری»

ئیستەش نازانم بکوُکم من بە شێعر

/ئیستەش نازانم ژمارە /یان شمارەم/ چەند بوو

ئەوکاتەی ،

کردیانە ملم و رەسمێکی ناشیرینیان پێوە خستم

بۆ« کەیسی» نازانم ژمارە چەندی

« ئەوین»

/ ئێستەش نازانم ئەو شوێنە

چاو بەستستانە/

کام مامۆستا ناوی «ئەوینی» لیَ نابوو؟

ئیستەش نازانم، ئەوین ئەسێحە یا ئەڤین

بەژمارەی هەموو ژمارەکانی ئەوین

ئیستەش نازانم چەند ژمارە هێشتا ماوین؟

زبوولی نیکسی چەند ژمارەش بووبە گرەم

هەر ئەزانم

ژمارە قوڕترین ناوە

مرۆڤی گەوج، لە سەردەمی مودێرنەدا، ژیانیەوە

هەڵیانژیان بوو بە عالەم

کیَ هەیە ژمارەی نەبیَ؟

مردنی ژمارە ... لە دایك بوونی ژمارە زێرین..

کێ هەیە بە ژمارەکانی عالەم سوێند نەکوژێ؟

شەرەف نەکڕێ ؟

حەیا «پس انداز» نەکا

ئازایەتی نەخاتە حیسابەوە

ئەوین نەفرۆشی، نەکا

تەنانەت دایکیان بە ژمارە، بۆ شەق کردووین

ــ پیغەمبەرکا،

چی ژمارەی جیهان هەیە

«ویرووس» بیخوا ..

{ کام شار هەیە ژمارەی ئیدزییەکانی

نەبوویێتنە«هەیوولا»}

٤ = ٤÷٤×٤

٤ =...٥-٤

٤=ئەونە هزار ئەنفال -٤

ــ ژمارەتان لە بیرنەچی!

ــ چەند هەناسە؟

ــ چەند جار ئەوین؟

ــ چەند ئەشقی فت؟

ــ چەند شیعری رەنگی چاپ نەدیو؟

ــ چەند وتاری خوێری بۆ چاپ؟

ــ چەند باوک؟

ـــ چەند سالْ؟

ـــ چەند هەزار شكست... هەرەس

ــ چەند خەونی زل،

به فیرۆ ماسی ـــ تاسی ـــ؟

شەق رەق ئەق شەق حەق شەق

بەسە!تەمەن بەشی ژمارەكان ناكا

زوو دەچێتە ژێر رادیكاڵەوە √

بەژمارەی تەلەفۆنەكانی موزاحیم

ئێستەش نازانم ژمارە چۆن ناگیرێ

ئیستەش ژمارەكەی خۆم نازانم

/كردیانە ملم و رەسمێ ناحەزیان پێوە ژیان:

بۆ كەیسی /نازانم/ ژمارە چەندی ئەوین!!/

هەر ئەزانم رۆژانە ٨ ژمارە جگەرە ئەكێشم...

هەتا ئاسمان

ژمارەیەكی بچووك ئەنووم /چركە،/

ژمارەیەكی زۆر ئاخ و داخ ..

چەند ژەم ئەپارێمەوە لە شیعر و

چەند ژمارە چیرۆك ئەكوژم تا ئێوارە و

چەند گۆڤار و رۆژنامە ئەدرێنم بۆ سەر سفرە و

خاوێن كردنەوەی شیشەو....

و هێندی رەسمی یادگاریش ئەسووتێنین

/نەوەک بکەوێتە دەس ژمارەکانی پۆلیس/

هەر ئەزانم تا ئەتوانی ئەبێ ژمارە لە

بیربەریتەوە بۆ وەی

ژمارەی تر فێربی /کە فێرنەبووم /

بەژمارەی هەمووتەلەفۆنەکانی

شەمێی بێچارە ئەزانم

یەک ژمارە رەنگی زیاتر نە ئەناسی

{ئەو کراس سوورەی بە ئەنقەست... شووشەی

خاوێن ئەکردەوە..}

یەک ئەشقیشی زیاتر نەکرد بە ژمارە ..

ــ ژمارەتان لە بیرنەچی!

{ بە تایبەت ژمارە تەلەفۆنەکانی : دایک ، برا،

دۆست، دەزگیران

زرژن، تەلەفۆنەکانی را بواردن..کچەکانی خیابان

بێوە ژنەکان..

ئەوانەی زوو مێردەکانیان بۆ یۆتۆپیا

سەریان‌ناوە،

ئەوانەی شەڕ خواردیانی

کچی ئەو برایانەی یەکیان مردان

زۆرن ژمارەیان مەترسن بەش هەموومان ئەکەن

.. ئەو چاو کاڵە ژمارەکەی چەند بوو ؟

ئەها ـــ چەند جار 666 ئەوەی تریان ئەوەی

شەقامی ژمارە

چوار جار 6666

ئەو چەتیوە قژ زەردەکە... سانیە ..ئالتوون

...ژمارە ..ژمارە

بە ژمارەی «ڕا»کانی« ئیسلأحات»

کیسەڵە ئەکەم و چاوم چناری تیا ئەڕوێ

ئەمە دوو جارە سنووق ئەخەمە ڕا کەمەوە پڕ

بەڵکو تاشە بەردەکەی« ئەخەوان»

«نەهێنیەکەی بدرکێنێ »

{تاقە بەردی بێ ئەژمارەی،

سەدەی بیستەم}

کە لامان وا بوو،چاکی یانی دیوەکەی تر

دیوەکەی تریش:

«سیزیۆف» ئەزانی و شیعر

چەند بارانێکی قاقڕە

بە ژمارەی پاسەکانی پیاوان

{یان بەشی پیاوان}

ـ دەیان ژمارە ئەڕۆم و ئەم «تارانە» کاول بووە

دوایی نایێ

هەر ژمارەی موبایلەکەی ئەو کابرا دێهاتیەی
هاوسێیان ئەزانم لە فینلاند
ــ {ڕۆژانە دێ ، من ژمارەی بۆ بگرم لە
دوبەی..
من قسەی بۆ بکەم / لەگەڵ کچەکەی ..
من لە زمانی ئەوەوە/بە ژنەکەی بڵێم:
خۆشم ئەوێ!
بە ژمارەی شۆرتی کچە خرپنەکەی..
................
ژمارەی مەمکبەندەکانی ئەو چەتیوە
«ئیسلەند»ییەی،
ژیان لە سوید ئەدا و
لە ئەڵمانیا سۆنا ئەکا بە منەوە..
ژمارە ..ژمارە..
ژمارەتان لێنەقومێ!
ژمارەتان پێنەتاشن!
تێتاننەخەن بە ئەژمارە!
ــ« ئالن پۆ »ئەوەند مۆدێرن بوو،
ژمارەی بۆ وشەش مۆدان!!
/چیرۆکانی/
سەمیرا هێندە دەنگخۆش بوو،

یەک شەویش بەر ئێمە نەکەوت

/ هەتا ئیدز../

«شەکیلا» ئەوەندە جوان بوو،

یەک گۆرانیشی بۆ نەهات،ئەوەندەی

دا..هەتا«عفریت»

ــ لێرە مەودا بۆ ئەو ئەژمارانە نییە

لێرە نابێ بنووسی 6 ..

وا ئەزانن، بە سێکس ئەڵێێ..

{لێرە ژمارە ئازادە جگە لە 6

بە ژمارەی هەموو شەشەکانی عالەم

من شەشان جار شەشەم کردوە و

باوکم هێشتا نەیزانی مرد.

ــ ئێستەش نەمزانی «سی دەزگا» سی خانوو

بوو..

/یان کەم.. یا زیاد../

هەر ئەزانم «عەلی» گوتی : با بچین! و چووین..

/«فمنیسم» دواجار بوو بە مۆد!/

هەڵیانمۆدان

+

# 2

**به ژمارەی ،ئیدزییەکانی سەردەمی مۆدێرنە و**

**ویرووسەکانی «هەیوولای» پۆست مۆدێرن..**

**هەر ژمارەی  مۆبایلەکەی ژنی ئەو کابرا**

**دێهاتیەی هاوسێمان ئەزانم،**

**لە «فینلاند»و**

**1 و 0 /کە دواجار جیهانی نڤیساری «بودریار» و**

**«دریدا»یان**

**وەک بەردە بێ ئەژمارەکەی«ئەخەوان» پێ**

**پشتەو رووکرد.**

**/جیهانی وێنە و سەتەلایت/**

**6،یش   /بۆوەی کە قاچاخە/**

لە ژمارەی یی...١٢٤ یش چەند ژمارەم لە بیر

ماوە ، باقی فڕین

بۆ ئەوە ژمارە مالأنەی/ قەدیمیان دەیانگوت

فیردەوس/

باوکم لە عیرفانییەکانیا ئەیچریکاند

بەهەشت... بەهەشت

«لە سەر پردی سەغرەالله

ئامینیان دا ... بە عەبدوڵا..»

بە نوری پاکت سەلەوات

دەف ــ دەف دەف

منیش ئیستا کە شیعرئەمژم

ئەلێم: حەجی نۆستالوژی و

ڕەوزەڕزوانی یوتوپیا.

بە شمارەکانی بەهەشت و

ژمارەی سانتیگرادی ئاگربڵێسەپشکۆکانی ئەولای

بەرزەخ

لە خۆرایی ئەمسووتێنن

من کافر نیم !

ئەونەی هەیە وەکوو هەللاج

ئەنەلحەقم ئەهونیەوە بە ژمارەی لێنزە

ڕەنگاڵەکانی چاوتا .... ئەو کاتانەی بەم چاویلکە

رەشەمەوە نەمئەزانی «لێنزن» و بە
موعجیزەیەکی خواییم ئەزانی ئەورەنگالە خوێن
مژانە./کە وەك لەیزێر تێتدەگرتم/
ئەریٚ شەمیٚ
منیش وەکوو تۆ وامزانی شەش یانی شەش و
بەس
ئەم قرتێکەوتوانەی ئیستا
/منالٚ ئەلێم زۆر ئەزانن/
بە کوردەی چوارسالانەم گوت:
کوردەگیان ماچم دەدەیتیٚ
«هێندی چاوی خومارکرد و وتی عەیبە!
زۆر پیٚکەنیم... وتم بچووك
وتی باشە لەوپشتەوە/تۆ چەند هاری شاعیر
نەبی/
بە ژمارەی منالٚەکانی سەردەمی فیودالٚی ئێرەی
مۆدێرن
نەمئەزانی کوردە چەندین ژمارەی لەبەر بوو...
چەند جاریش موزاحیم بووبوو... پیٚئەکەنی...
ئەریٚ حەززەتی ژمارە بە ژمارەت!
ئیستەش ژمارەکانی دۆزەخ نازانم

باوەکوو ئەوهەمووەش تیا سووتێنرام ـ/رچیام/
رچێوراوم
سەهۆڵێنرام..
ژمارەی فارنهایتی جەستەی شێعرم
چووەتە ژێر سفر
سفریش ژمارەیەك نەحسە
بە ژمارەی بورژواکانی بازار
{ژمارەی هەمارەکانیان زیاد دەکا}
«مەبنای»ژماردنەکان دەکا بە میلیون
ـــ دووتمەن یانی دووملوێن ـــ
١٠تمەن شیلە بنێرن بۆ هەمار!
٢٠تمەن لەحیسابەکەم هەڵگرن ـــ ژمارەیکەن...
ژمارەی «چەك»ەکەم چەن بوو ٣٠ تمەن...
«چەك»لەو وشانەیە کە فرِی بە سەر چەکی
سالأنەوەنیە/وانموودە/
چەکی شەرەف... ئیستا چەندین جۆر ئەتەقن
سەوز، ١٠٠٠ی دەبێ بەتمەنێ
ـــ بەچەك ... هێندێ قەڵەوترە و شان و باهۆی
لەسەوز
ناچێ و بەفیزەوە لێیدەروانێ

/ئەمە لە زمانی ئەو کابرا دێهاتی‌یەی
هاوسێمانەوە ئەڵێم نەخەلەتن
من شاعیرم
ئەها ریشم چەندە جوانە.
ئێستەش لای من چەک هەر چەکە..
کاتێ نووستن لەشانی‌ئەکەم بو ناوخەون..
لەشکەری هیتلەری پێ بکوژم ــ فیلمەکانی
هالیوود ژمارەیان لە ژمارە تێپەری و چەکی
بازاڕی‌یەکانی شەمێخۆر
نەگەیشتنە تەقینەوە و هەر پان ئەبن
..هەرئەماسن ــ
بە ژمارەی /ڕا/کانی «رەئیەکانی»ئیسلاحات
کمۆنیست نیم مەمسووتێنن ببمە سەهۆڵ
من شاعیرم و وائەزانم
کمونیستیش ناوی بە خۆیەوەیە کمۆن نیست و
هەر نەبووەو
قەتیش نابێو
}ئەمە یان ئیستالین نووسی ئەو کاتانەی من و
مندلشتایمیان بانگ‌کرد شیعرێ تێکەین..
/وەک ئێستای مامۆستا حەمە/
ــ پێکێک بدەینە دەست سەرۆک

ــ من به په‌له پێكه‌كه‌یم دایه چاوی

و هه‌لیْقوڕاند ــ

مندلشایمی نه‌گبه‌تیش /وه‌ك ئیستای من/..

تێینه‌كردو

له سیبری سووتا... نازانم به چه‌كی ژماره

چه‌ند... نازانم...

نازانم .به خوا..به پێغه‌مبه‌ر... ده‌ڵیم گه‌ڕێن...

«من شاعیرم

خۆ رۆسته‌م نیم... ئ...ا....خ...

كوڕینه ژماره‌كانی سه‌رۆكتان له بیرنه‌چێ

ژماره كه‌وشی «بۆیاخچییه‌كه‌ی سه‌روك»

ژماره ده‌رپێی كه‌یووه‌مه‌رسه‌كه‌ی به‌رده‌ستی

ژماره مه‌مكبه‌نده‌كانی ئه‌و كابرایه‌ی،كووره‌كانی

به گاڵته‌وه كووران بۆ وه‌ی به گاڵته سابوون له

چه‌وری مرۆڤ هه‌ڵكه‌ن،مۆم له شه‌می پیاوان

سازكه‌ن ..

له خۆشگۆشته‌كه‌ی ژنانیش..رۆنی پێست بۆ

«ئاوا براون» هه‌ڵپێسێنن..

«ئاوابراون»یش ئاشق بوو

ئه‌ری كوڕم مێژوو جوكێكه مێژوونووس

بۆ پێكه‌نینی مناڵه‌كانی سه‌رۆك ئه‌ینووسێ..

/پێمەکەنە/

من شاعیرم...ئەها ریشم چەندە شێعرە...

.......................

تلویزیونی aiwa ی ژمارە نازانم 420 T1 ی

دیوەکەم

ئیستا دەڵێ: ئەم وشانە لە چاویلکەی شیشەی

رەشی ژمارە سەلبی‌یەوە

هەلقوڵیوە و هەر ئێستە

باران لە تاران باریوە و ئاو هەڵساوە

بە شەرمەوە بەرێزان

بە شەرمەوە پێتان دەڵیم:

شاعیر چی لە باران داوە؟

بشبارێ هەرنەباریوە

بۆ وەی ژمارەی $H_2O$ دڵۆپەکان

نەژماردراون .. کە واتە هیچ

تا باران بەژمارە نەهێننە نووسین لە سەردەمی

پوست مودیرندا یانی نەبوون

تا چەند ژمارە نەختکین.. ئاویش بێ ئاو

بە شمارەی تلەویزیۆنەکانی عالەم

تلویزیۆن درۆ ئەمژێ

یان ئەهارێ

یان ئەجاوێ

ئەگینا تاران و بارین؟؟!!

به ژمارەی هەموو پاسەکانی تاران

ــ بەشی پیاوان ــ

شەشان ژماره شەقام شەق بوو و ئەم تارانە

کاولبووەش دوایی نەهات...

ــ شەش مجەلله بەونە تمەن!

تۆم ..توو بۆ ریگا...

ساردی ئاغا ساردی هەرزان

/بۆیاخچییەکەی شێرکۆ بوو/ژماراندبوویان/

وایدەزانی چونکە ریشم ئەونە پانە

حەتم دەبێ چەك داریش بم

/چەك بەمانای سەردەم دەڵێم/ وانمووده/

ــ دامن کشان حسن دلاویز را چه غم

کاشفتگان عشق گریبان دریده‌اند

هرگز جماعتی که شنیدند سر عشق

نشنیده‌ام که باز نصحیت شنیده‌اند

بارانی چی دە لێمگەرێن کمونیست نیم

بەژمارەی ئەو کمونیستانەی

له بیست میلیون

ــ له گۆشە نیگای بازاریەوە ــ بیست تمەن

تێپەرین و لە شەڕی دووی عالەمیدا هەڵفڕین
من قەت کمونیست نەبوومە و ئیستاکەش نیم
دەڵێم گەڕێن ...
ــ تۆم ..بیسکویت، ساردی
تۆم ... بۆ ناو ڕێگە
ــ بە ژمارەی هەموو شەڕەکانی عالەم
یەک ڕێگاشم هەتا ئاخر بۆ نەپێورا
کەوتمە ڕێگالۆزی ئەم سەردەمی وشەستانە...
کە وشەیانی هەمووشت
بە ژمارە و بێ ژمارە
ئەشا ئەو سەردەمە قۆڕە ــ گۆڵ یانی گول
سوارۆ دەڵێ: ئولیوێرکان قەت گۆڵ ناخوا
ئولیوێرکان گوولی«ئەو گۆڵانەی خوارد کە
مەخرووتییەکانی سەر سینگیان پیشان ئەدا
سوارۆ بەتەوسەوە ئەڵێ:
ــ تۆ هەر ژمارەکەی رۆناڵدۆ ئەهۆنییەوە...
ئەگینا
دووجار نەبێ گوڵی نەخوارد ..
/ڕێبین ئەیگوت: یاری برزیل یانی شیعر/
ـ ئەری رۆڵە هەر ئەو دووجارە بەس بوو بۆ
رەشی ناو چاوی زانست

هەر ئەو دووجارە بەس بوو بیسەلمێنی

ــ رووسپیەتی هونەرستان ــ

بە ژمارەی لە هونەرمەند چووەکانی عالەم

بە ژمارەی ئەو شاعیرانەی

بە یەك ژمارە خوێندنەوە{گوڤار}

مودێرنەن و

بە متالآی نیو ئەژمارەش پەساموٚدێرن

ئیستەش نازانم مودێرنم ..

یا پوٚست موٚرێرن ئەوی تر

هەر ئەزانم كمونیست نیم/دێموكرات نیم/

دە لێمگەرێن .. پێستم بەشی كابل ناكا..

بوٚیە دەگریم...

دەمم بەشی مشتتان ناكا... بوٚیە دەمرم

ــ بەشەرەفم من بێت و ئیتر باسی سیاسەت

ناكەم...

«ئەو قەتارە *چوٚلەی*» كە ئیمە رێلیشمان بوٚ

دانەناوە

سیاسەتی چی... من شاعیرم... خوٚ هێركوول

نیم... دەلَیم گەرێن.

ئەها ریشم...

ئەها ریشم چوٚن داداوە!

ــ ژمارەتان لە بیر نەچی ژمارەی رەنگ ــ
ژمارەی دەنگ ــ ژمارەی حیزیی، ژمارەی ئەوین،
لە هەموویان مەسخەرەتر ژمارەی فایل..
ژمارەیسایتWWW
ژمارەی فاکس،
بە شمارەی هەموو فاکسەکانی عالەم
فاکسم نیە و هیچیشیان بۆ نەناردوومە
جاسووسی چی.. چی تاوانی جیهان هەیە بە
ئەژمارە مۆریان دەکەم... بەلاَم بە خوا...بە
ژمارەی مۆریانەکانی
ناو داری سک ماسیوی ژووره یەک/پینج
کەسییەکەمان ــ من جاسووس نیم
ژمارەی یەک جایش نازانم.. ئەوە خۆم ..
ئەوەش هەموو ئەو یادداشت و قاقەزانەی لەویٚ
گواستووتانەتەوە بۆ ئەم بەندە کەرٍ و کوێرە.
نالی بێچارە ناچاربوو لەبەر خەڵک
شیعر بەخواییشدا بڵێ
منیش ئەگەر ئالأیەکم رەنگ کردبێ
/یەک ژمارە.. یەک/

لە دڵمەوە نەمشیعرانە!{ نەشمزانیوە سوور
ڕەنگی شەیتانەو بەس... ئەوەی جەنابت
دیفەرمووی }
لێرە کێ باسی دڵ دەکا ــ دەڵێ چی گەوج!
ئەمە بازجوویی ئاخرتە بەرە و سووتان
هەر بڵێ ڕەنگت کرد یا نا؟
ــ وتم ، ئەگەر .. هەزار ژمارە ئەگەر و ڕەنگە و
« شایەد»
نابنە تاقە ژمارەیەک ــ هیچ وشەیێک ــ نا...
نا... نا... نا
ــ ئەویش دێت هێندێ هەناسە
گڕە گڕ
ئەپرژێنێ بە ملم دا .. بەڵکو بۆ یەک ژمارەش
بێ
ــــ ناوی بێتە دنیایی شیعرــــ
بەو هەموو مهرەبانییەوە نازانێ
شیعر هێندەش ئاسان نیە ــ جیهانێکە بە زۆر
کەسی تێناتەپێ
بە شمارەی هەموو تەلەفوونەکانی عالەم
بە ژمارەی هەموو ئەو ژمارە لارو قیچانەی
کتێبخانەی مللی /سەرەتا ئەیدا/

به نوسخەی ژماره ١ و٢ی ئەو کتێبانەی بەرێ
دەکرێن بۆ«موجەووز» و هەرگیزیش زاوزێ
ناکەن /هیچ یش/
«چی قسەی قۆڕی جیهانه
لەم شیعرم پێ سەرەك تره»
بەلاَم .. شاعیرەتی زۆر ئاسانه
وەره بیگره ئەوه ریشم
ئەهانێ چۆنم باداوه!
ــ پاسێك / له بەشی ژنانەوه/ ڕێگەی
پاسەکەمان ئەگرێ
کابرا له خەو رائەچڵەکێ
ژنیك دەست ئەکا به بۆ ڵه
/لەژێرەوه هەر شێعرئەدا
به ئاسمان و زەوی و زمان/
ژمارەی کات ژمێرەکەی تێپەریوه و
ڕێگەش هێشتا به ژماره زۆری ماوه
مندالێکی دەست بۆ یاخیش
ئادامسەکانی ئەژمێری
«ــ هەتا ئاخر چەندەی ماوه»
شیر پەنجەی ژماره/... ئەونەش/
دەفتەری دڵی «مەلەکشا»ی

کردۆتە مەڵبەندی هێرش

بۆ سەر مورفین...

« ڕێ لە جەلالیش بەسراوە

هەتا لووتکەش زۆری ماوە»

منیش لێرە لەم پاسەدا

وشەو ژمارە ئەبژێرم. بۆ شێعرێکی بێ ئەژمارە

ــ ئادامس ئاغا .. زۆری ماوە

شیعریش بۆتە بنێشتە خۆشە

نیوەمان لەم ژمارەدا شێعر ئەجاوین

ــ تازە کێ ئادامس ئەجاوێ...

ژمارەی ڕۆژەکەی چەنە

نەفەوتابێ؟

بە ژمارەی هەموو کۆ پینەکانی ئێران

سەدان ژمارە هێشتا ماوە

لە قورگی پێنووسەکەمدا ئەقیژێنن

ــ ناومان بێنە بۆ وەی نەمرین

ژمارەیەکمان بدەنێ بۆ وەی نەمرین

سەقفی ژمارە ~~6ی~~/خەت کێشراوە/ نان تا

سەقفی ژمارە 4ی ئازادی ...

ــ هەزار ژمارە سەقف هەنە... نەنووسراون

چیم پێدەکری ئەم قەڵەمەش

**هێشتا ژمارە نەکراوە...**

**زەحمەت نەبێ بە سەر شاعیرێکی دیوان دارا**

**بقیژێنن ـــ من شاعیر نیم**

**هەر چەند ریشم هێندە پانە!**

**بیچارە نالی ناناسێ،**

«سوَ لة فةقروفاقة وةكوو فاقة فاقي دا

تةسبيَحي دام و دانةية ريشي دووفاقي فاق»

**ئەرێ حەزرەتی ژمارە ـــ بە ژمارەت ـــ**

**هیچ دیوانە دێوانەیەکی من بێت و یەک ژمارەی**

**نەخواردەوە**

**ـــ بە ژمارەی بێ ئەژمارەت ژمارەیەکیان**

**نەبژاردووە بۆ شێعرێکم ـــ**

**چ سەوز ـــ چ چەک ـــ چ سپەە چەک**

**بنەمای بژاردن لای من وەکوو جاران هەر قەرانە**

**مەشەیی‌ش قەت لە بی ناکەم**

**ژمارەی گیرفانەکانی بۆ پڕ دەکردین لە مێوژ**

**بە یەک قەران**

**مەشەیی بیچارە فڕی و**

**قەرانیش عەمری دایە تۆ...**

**/ئیستە بنەمای بژاردن یەک ملوێنە**

**ـــ بە ملوێن ئەڵێن یەک تمەن ـــ/**

؟؟؟، نەخەڵەتن،

ئەمە لە زمان دێهاتییانەی هاوسێکەمان

ــ بۆ ژنەکەی ئەنووسمەوە

باوەڕ فەرموون...

بۆ خۆم ژمارەی بۆ دەگرم

لە گەڵ ژن و کچەکەشی قسان ئەکەم... ئەوان

6 زۆر چاك ئەناسن..

سەر سوورێکی ژمارە لووسکە

لەوانەی ئەگەر تاریکان، کاتی مەستیم لە چۆڵیدا

بمدیبایە..

ئیتر تەواو....

لە«میترۆ»کەی ستۆکهۆڵما رێی پێگرتم

ــ کەللەرەش بچنە دەرەوە

نەشی ئەزانی شاعیرم

ــ چووبووم کرێنۆشم بۆ ببەن ــ

کیژێ سنیگ رووت نەبوویایە...

/چوون تیئالان/ئەیانکوشتم...

ژمارەیان نەکردبووم... ژمارەی کەمپەکەی

خۆشم لە بیر نەبوو

نە ژمارەی ئەو پاپۆڕەی

هەرچی تا ئێستە رستبووم..لێی سەندبووم

بۆ وەی وەك کەر

لە شوێنی ئاژەڵی نەخۆشدا... لە بەحرەکەم

بەردەباز کا

بە شمارەی ئەو ئەسپانەی لە

فیلمەکانی«ویستێرن»دا داخیان ئەکەن

بیزیان نەهات داخیشم کەن

کەچی«پرشنگ» لە ئەورووپا بە فیزەوە شریتێکی

ویدیۆییمان بۆ دەنێرێ

ــ گازێکی فرمان کرپوە

ــ پارەی بێکاری وەر ئەگرین

ــ ئیمەش وشە ئەتروکێنین بە سوئێدی...

ئەی ئەو هەموو وشەی خۆمان بۆ سەر ئەبرن

ئەی ئەو گشتە شیعرەی نالی، شیرکۆ، رەفیق،

بەختیار...ساڵە

بۆ بە بیرە و خەیاڵەوە ناتەقێنن...

ــ من پەپوولەم بەقەدەر ئێوە خۆشئەوێ

لە ئێوارەکانی کارناوالْ؟

ــ لێرەش وشە هەیە ناسک ، کەڵەگەت، شیرین ــ خرپن ــ

شان پان،توورە، ئەهوەن،کە هەر هەموویان شاعیرن

شاعیرێ نیم شێعری غوربەت نەمختکێنێ

با ژمارەکانیش بە ئینگلیسی... یان سوئێدی .. لێدرابێ

با بە فرۆکەی ژمارە ئەونەش ناردرابێ

ــ پۆستچی لای ئێمە شیعری ژمارە شەشی تۆی دران... ئەوسا پیدام

مقەستچییەکەی هاوسێمان هەرچی کردبوو، سەری دێرێکی ژمارە

خوێنشیرینی بۆ نەبرا بوو...

دوێنێ بەرێکرا بۆ قەبرانی ژمارە ٣ ی پالْ ئایچی ــ

ش... خ... خ... خ...ش...

لیرەدا دیجیتالی مێشکم..بەشی شێعر ئەکوژێتەوە

ــ بازارموشتەرەکەــ چارنیە.. گەرمی کردەوە ــ

ژمارەکەی وانمووده

SONYی درۆ... ئەیکوژێنمەوە

.........................

.........................

ــ ژمارەتان لە بیر نەچێ

ــ هەموو فایلەکانی تەمەن/ثالث/ گشتی، ئاگری

/تاقه کەسی... جیازی ..«ئاسایشی

کۆمەڵایەتی»«دەرمانی »«جەستەی» ماشین ..

دزی .. حیزی/جگە ئەشق و ژمازەی 6

...2000/19/140/8997
2001/15/150/6789

ژمارەکانی نهێنی... ژمارەی **سوور** .. ژمارەی

کرێکارەکانی

/غەیرە مستعمەل/

ویندۆزی 2001 باشترین پارێزەری ژمارەیە..

/دروشمێکی کانسێپچوال/

ئەی /تی/ ئیکس ژمارەکان بە ڕەنگیش

دەخوێنێتەوە

ئەی/ئێس/4دی/ گرین مانیتۆر بە دەمامکی

پارێزەری چاوەوە..

ئاگاتان «لە کلیکی»**فورمەت** بێ!

ژمارە نا بێ بکوژێتەوە!

/کوشتنی ژمارە قاچاخە/

خوێنی ژمارە لە **خوێنی سیاوەش**یش سەوزترە

/دیەی ژمارە بە وشتریش ناحیسابێ/

نارەقەمێ...

ئەر قهمەر راقمین..هاوار!

دیسکەلنا ژمارەتاً بجمیلٌ حەسەبات...

به ئەوینین حیسەبات...

فیشەتون تجارتی والشوعبەُنناوەراست-۶۱۶۰

«کچە حەیران دەڵێ،

بابی من گەڵێ زاڵمینە

من ناداتە کورٍ شاریان... ئەڵێ،

ئەوان دەستی خۆ بە کیژان گەرم دەکەنەوە»

CD/Cn... سی/دی سلاچ سی ئێن ژمارە تا

Delete

۷۹ دوجار

رۆستەمی نوێنەری ژمارە ۸۹۷۸ ی ئیران

سووزەنی، ژمارە ئەهۆنێتەوە.. مونشی بۆ

تۆرخستنی ژمارە...پاساواندنی ژمارە

لەنووسێگەی ژمارە ۷۹۹۸ی«حەماڵئاوا»!!

{ژمارەتان بۆ ئەم ناوە لە هیچ فایلێک دا نە

دیتەوە}

ژمارە.. ژمارە.. ژمارەی بۆ ببیننەوە..Find

بابگەرێ،

..........

لە سەرووی شەقامی خواوە...

کۆلانی چاوه حەزینەکانی شیعرێ مهست

ئەشووشی و ئەتلێ وئەقرتێ...

بێ ژماره ئەچرپێنێ چرپ.. چرپ.. چرپ

به ژمارەکانی شەشینی سوور .

شەقامه ژمارەکانی ئێستای ژین ئەژێیم

پر به سیهکانی ژینه ژین

تا چریکه تا نزم له سەرترین شەقام .. که

خوا/ئەوین/

ژمارەتا .. هەت .....

٤١...١٢٣٥٤ و ٧٤٨٥٢٢٥٠...

١١٠٦٤ ی خۆم /ژمارەکەی ئەوینم له

بیرنیه/مهخابن

ئەیژمارێینن .. ژمارەتون شماره..

به سەری هەمووتان سۆیناوی قەسهمام...

ئەگریم که شێعرمری و من مام

شەقه شەق تا شهقامه چۆڵەکانی ئهشق،

که چوو و فڕی و نەما

ژماره ... ژماره... ژماره..

ژمارەتان له بیر نەچێ ..

***